یەکەمین ماڵپەڕی کوردی تایبەت بە پرسیار و وەڵامی شەرعی



# چۆن ترس لە خوای گەورە لە دڵەکانمان زیاد بکەین؟

الشيخ: إبراهيم بن عبد الله المزروعي

وەرگێرانی : ستافی وەڵامەکان و ماڵپەڕی بەهەشت

ba8.org - walamakan.com

بسم الله الرحمن الرحيم

**الحمد لله رب العالمين،والصلاة والسلام على نبينا محمد وعلى آله وأصحابه وأتباعه الى يوم الدين ،أمّا بعْد..**

**گەر بەندە بیەوێ دڵی پڕ بکات لە ترسان لە خوای گەورە ئەوا دەبێ ئەم خاڵانە جێ بەجێ بکات :**

**(١) بیر لە گەورەیی و مەزنی خوای گەورە بکاتەوە, وە خوای گەورە فەرمویەتی:** ﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦ وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطۡوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٦٧ ﴾ الزمر **(٦٧) واتە: ئەو هاوەڵبڕیاردەرانە بەگوێرەی پێویست خوایان بە گەورە نەزانیوە و قەدری خوایان نەگرتووە , لەکاتێکدا کە شت وکەسی تریان لەگەڵیدا پەرستووە ، کە نە سوود**

دەگەیەنن و نە زیانیش لادەبەن , بۆیە دروستکراوی بێدەسەڵاتیان هاوتا و یەکسان کردووە بە دروستکاری گەورە و بەتوانا , کە یەکێك لەگەورەییەکانی دەسەڵاتی لەدوارۆژدا ئەوەیە کە هەموو زەوی بە دەستەوە گرتووە و ئاسمانەکانیش بەپێچراوی بەدەستی ڕاستەوەیەتی , پاکی وبێگەردی وگەورەیی بۆ خوا لەوەی هاوەڵبڕیاردەران دەیکەن بە هاوبەش بۆی .

لەم ئایەتەشدا بەڵگەی تێدایە لەسەر سەلماندنی بەدەستەوەگرتن و لای ڕاست و پێچانەوە بۆ خوا بەشێوەیەك کە شیاو و لایقە لەگەڵ گەورەیی ومەزنێتی ئەودا وبەبێ چۆنێتی بۆدانان و لێکچواندن .

هەروەها فەرمویەتی: ﴿يَوۡمَ تُبَدَّلُ ٱلۡأَرۡضُ غَيۡرَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُۖ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ ٤٨﴾ إبراهيم (٤٨) . واتە: تۆڵە سەندنەوەی خوای بەرز و بڵند لە ڕۆژی دواییدایە ئەو ڕۆژەی کە زەوی تیایدا دەگۆڕدرێت بە زەویەکی تر سپی پاك وەکو زیو ، وە هەروەها ئاسمانەکانیش بە جگە لە خۆیان دەگۆڕدرێن ، و دروستکراوەکانیش لە گۆڕەکانیان دەردەکرێن بە زیندوویی و ئاشکرایی بۆ گەیشتن بە خوای تاك و تەنهای زاڵ بەسەر هەموو شتێکدا ، ئەو خوایەی کە تاك و تەنهایە لە گەورەیی و لە ناو و سیفات و لە کردەوەکانی و لە ملکەچ کردنی هەموو شتەکان بۆ خۆی .

**وە لە سیما و نیشانەکانی مەزنی و گەورەیی خوای پایەبەرز ئەوەیە کە لەرۆژی دواییدا سەرەتا و کۆتایی هەموو دروستکراوەکانی کۆدەکاتەوە پێکەوە وەکو دەفەرمووێت:** ﴿قُلْ إِنَّ ٱلْأَوَّلِينَ وَٱلْـَٔاخِرِينَ ۝٤٩ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ۝٥٠﴾ (الواقعة:٤٩-٥٠) **واتە: دەسا تۆش ـ ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ـ پێیان بڵێ : بێگومان بن کە پێشینان و پاشینانی نەوەکانی ئادەم هەر هەموویان لەڕۆژ و کاتێکی دیاریکراودا کۆ دەکرێنەوە ، کە ئەویش ڕۆژی زیندووبوونەوەیە .**

**جا بۆیە بەڕاستی تەنها خوا گەورە و تۆڵەسێن و بەدەسەڵاتە.**



**(٢) بیرکردنەوە لە مردن و دوا ساتەکان و کۆتا کردەوە: ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەستی ترسان لەخوا زیادبکات لەناخی بەندەدا, کە بیر لە مردن و ناخۆشیەکانی و ساتی رۆح کێشان و ئەو کاروکردەوەیەی کە دواهەمین کردەوەتە ولەسەری دەمریت, چونکە بەڕاستی مردن ناخۆشی و نارەحەتی خۆی هەیە, کە تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەریدا هاتووە, وە خوای گەورەش فەرموویەتی:** ﴿وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ ١٩﴾ ق (١٩ ) **واتە: سەختی مردن و ناخۆشی و نارەحەتیەکەی پێش هات کە هیچ گەڕانەوە و دەربازبوونێك لێی نیە , ئائەمە بوو ـ ئەی مرۆڤ ـ کە تۆ لە دەستی هەڵدەهاتیت .**

**پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:** (إِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلَّا ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ فَيَدْخُلُهَا)[٧]، **واتە: هی واتان هەیە کاروکردەوەی بەهەشتی دەکات هەتا لەنێوان ئەو و بەهەشتدا ئەندازەی باڵێك دەمێنێت و کەچی کتێبەکەی دەهێنرێتە پێشەوە و کاروکردەوەی دۆزەخی دەکات و دەچێتە ئاگرەوە.**

**پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:** (إِنَّ الْعَبْدَ لَيَعْمَلُ فِيمَا يَرَى النَّاسُ عَمَلَ أَهْلِ الْجَنَّةِ وَإِنَّهُ لَمِنْ أَهْلِ النَّارِ، وَيَعْمَلُ فِيمَا يَرَى النَّاسُ عَمَلَ أَهْلِ النَّارِ وَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَإِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِخَوَاتِيمِهَا)[٨]، **واتە: کەسی وا هەیە کاروکردەوەی**

---

(٧)متفق عليه :أخرجه البخاري حديث:٣٠٥١,وأخرجه مسلم حديث:٤٨٨٨

(٨)أخرجه البخاري حديث:٦١٣٨

**وەها دەکات کە لەپێش چاوی خەڵکی وادەردەکەوێ کە بەهەشتیە و کەچی لە ئەهلی ئاگرە, و کەسی واش هەیە کاروکردەوەی دۆزەخ دەکات و کەچی لە ئەهلی بەهەشتیشە, چونکە بەڕاستی کاروکردەوە بە کۆتاییەکەیەتی.**

**وە پێشەوا** ابن بطال **دەڵێت: " لەوەی کە مرۆڤ کۆتا کاروکردەوەی خۆی نازانێت حیکمەتێکی گەورەی تێدایە, چونکە ئەگەر بیزانیایە کەوا کۆتا کاری باشەیە ئەوا سەرسام دەبوو بەخۆی و تەمبەڵی دەیگرت, وە ئەگەر بیزانیایە کە خراپەیە ئەوا سەرپێچیەکانی زیاتر دەبوو وە دوورتر دەکەوتەوە جا بۆ ئەوەیە کەسەکە لەنێوان ترس و ئومێد دا بژیت ".**

**(٣) بیرکردنەوە لە گۆڕ و قیامەت و ئاگر، هۆکارێکە بۆ دروست بوون و زیاتربوونی هەستی ترسان لەخوا لەناخی مرۆڤدا: چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:** (مَا رَأَيْتُ مَنْظَرًا قَطُّ إِلَّا وَالْقَبْرُ أَفْظَعُ مِنْهُ )[٩] **واتە: هیچ دیمەنێکم نەبینیوە ئیلا گۆڕ لەوە سامناکتر بووە.**

**وە گۆڕ تاریکیەکی زۆری تێدایە وەکو لە فەرموودەدا هاتووە:** (إنّ هذه القبور مليئة ظلمة على أهلها )[١٠]. **واتە: ئەم گۆڕانە پڕن لە تاریکی بۆ سەر خاوەنەکانیان.**

(٩)ت.هـ.ك صحيح الجامع (٥٦٢٣).

(١٠)متفق عليه أخرجه البخاري حديث:١٢٨٥,وأخرجه مسلم حديث:١٦٣٩

**وە کاتێك جەنازە دەخرێتە ناو گۆڕەوە لەو ساتەدا دەیگوشێت و ئەو گوشینەش کەسی لێ دەرناچێت وکەسی لێ بەدەر نییە منداڵ بێ یاخود گەورە, پیاوچاك بێ یان پیاوخراپ, ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:** (إِنَّ لِلْقَبْرِ ضَغْطَةً، لَوْ كَانَ أَحَدٌ نَاجِيًا مِنْهَا نَجَا سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ)(١١) **واتە: گۆڕ گوشین وپەستانێکی هەیە, ئەگەر کەس هەبووایە لەوە قوتاری بێت ئەوا سەعدی کوڕی مەعاز لەوە رزگاری دەبوو.**

**لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە:** ( لو أفلت أحد من ضمة القبر لنجا هذا الصبي )(١٢) **واتە: ئەگەر یەکێك**

---

(١١)رواه أحمد وهو في صحيح الجامع (٢١٨٠)

(١٢)صحيح الجامع (٥٢٣٨)

**قوتاری بێت لەم گۆڕگوشینە ئەوا ئەم مندالە لێی رزگار دەبوو.**

**وە فیتنەیەکی تری ناوگۆڕ هەیە ئەویش بریتیە لە پرسیاری دوو فریشتەکەی ناوگۆڕ کە ڕەنگ ڕەش و چاو شینن (ترسێنەرن) کە پێیان دەوترێت (المنكر و النكير) وەکو لە فەرموودەکەی برائی کوڕی عازبدا ﷺ هاتووە کە دەفەرموێت:** (فَيَأْتِيهِ مَلَكَانِ شَدِيدَا الِانْتِهَارِ فَيَنْتَهِرَانِهِ وَيُجْلِسَانِهِ، فَيَقُولَانِ له: مَنْ رَبُّكَ؟ وَمَا نَبيُك ؟ . وَهِيَ آخِرُ فِتْنَةٍ تُعْرَضُ عَلَى الْمُؤْمِنِ ) (١٣) **، واتە: دوو فریشتە دێنە لای کە زۆر سامناك وترسێنەرن و دایدەنیشێنن و پێی**

---

(١٣)رواه أبو داود والحاكم .

دەڵێن: خوات کێیە؟ پێغەمبەرت کێیە؟ کە ئەمەش دواهەمین فیتنەیە تووشی باوەڕدار دەبێت.

جا پێشەوا ئەلبانی –رەحمەتی خوای لێ بێت- کۆمەڵێك سوودی بەکەڵکی لەسەر ئەم فەرموودەیە نوسیوە و کۆکردۆتەوە لەکتێبەکەیدا بەناوی (أحكام الجنائز)لە لاپەڕە ٥٩ دا, وە لەناو گۆڕدا سزا وخۆشیش هەیە, و بۆ سزاکەش هۆکار و هۆکاری رزگاربوونیش هەن.

(٤) بیرکردنەوە لە قیامەت و دیمەنەکانی و حاڵی خەڵکی و کۆکردنەوەیان و لێپرسینەوەیان و پردی سیرات و جگە لەوانەش کە دەبنە هۆکاری دروست بوون و زیادبوونی هەستی ترسان لەخوا لەناخی بەندەدا.

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّجْمُوعٌ لَّهُ ٱلنَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ ﴿١٠٣﴾﴾هود (١٠٣) ، **واتە: ئەو ڕۆژەی کە هەموو خەڵکی بۆ کۆدەکرێتەوە بەمەبەستی لێپرسینەوە و پاداشت ، کە هەموو دروستکراوەکانی ئامادەی دەبن .**

**پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:** (يُحْشَرُ النَّاسُ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلًا، قالت عائشة : يَا رَسُولَ اللَّهِ، الرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ جَمِيعًا، يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ؟ قَالَ: «يَا عَائِشَةُ، الْأَمْرُ أَشَدُّ مِنْ أَنْ يَنْظُرَ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ» )[١٤]. **واتە: لە ڕۆژی دواییدا خەڵکی بە پێی پەتی و بەڕووتی و بەخەتەنە نەکراوی حەشر دەکرێن, عائیشەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی ئایا پیاوان وئافرەتان سەیری**

---

(١٤)متفق عليه :أخرجه البخاري حديث:٣١٨٧,وأخرجه مسلم حديث:٥٢١٢ .

یەکتری ناکەن؟ ئەویش فەرمووی: ئەی عائیشە حاڵەتەکە لەوە نارەحەتتر ودژوارترە کە تەماشای یەکتر بکرێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَذَٰلِكَ يَوۡمَئِذٖ يَوۡمٌ عَسِيرٌ ۝٩ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ غَيۡرُ يَسِيرٖ ۝١٠﴾ المدثر (٩-١٠) واتە: ئا ئەو ساتەیە کە رۆژێکی زۆر سەختە لەسەر بێباوەڕان ، و دەرباز بوونیان ئاسان نیە لەوەی کە تێیدان لە موناقەشەکانی لێپرسینەوە و جگە لەوانەش لە دژواریەکانی ئەو رۆژە .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَكَيۡفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرۡتُمۡ يَوۡمٗا يَجۡعَلُ ٱلۡوِلۡدَٰنَ شِيبًا ۝١٧﴾ المزمل (١٧) واتە: جا ئەگەر ئێوە هەروا بێباوەڕ بن ئیتر چۆن لە سزای ئەو دوارۆژە خۆتان

**دەپارێزن کە لەبەر سەختی ترس و ناخۆشیەکانی منالّی ساوا تیّیدا پیر دەبیّت ؟**

**خوای گەورە دەفەرمویّت:** ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ١٠١﴾المؤمنون (١٠١) . **واتە:**

**جا کاتیّك کە دوارِۆژ دیّت ، و ئەو فریشتەیەی کە راسپیّردراوە بە فووکردن بەکەرِەنادا فووی پیّدادەکات ، و خەڵکی لەقەبرەکانیاندا زیندودەبنەوە ، ئەوا لەو کاتەدا شانازی ناکریّت بە رِەچەڵەك هەروەکو چۆن لەدونیادا شانازیان پیّدەکرد ، و هیچ کەسیّك پرِسیاری کەسی تر ناکات .**

**خوای گەورە دەفەرمویّت:** ﴿تَعۡرُجُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيۡهِ فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥ خَمۡسِينَ أَلۡفَ سَنَةٖ ٤﴾ ( المعارج:٤ ) .

واتە: فریشتەکان و جبریل بەرز دەبنەوە بۆ لای لە ڕۆژێکدا کە ماوەکەی پەنجا هەزار ساڵی دونیایە ، و لەسەر باوەڕداران بە ئەندازەی ماوەی نوێژێکی فەرزە .

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ كَأَنَّهُ رَأْيُ عَيْنٍ فَلْيَقْرَأْ ﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ١﴾ ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتْ ١﴾ ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ ١﴾) [١٥].

واتە: ئەوەی پێی خۆشە سەیری قیامەت بکات وەکو بینینی چاو ئەوا با ئەم سورەتانە بخوێنێتەوە: (﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ١﴾ ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتْ ١﴾ ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ ١﴾).

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (تَدْنُو الشَّمْسُ الشَّمْسُ يَوْمَ القِيامَةِ مِنَ الخَلْقِ حتَّى تَكُونَ مِنْهُمْ كمِقْدارِ

(١٥)رواه أحمد و الترمذي وهو في صحيح الجامع (٦٢٩٣) .

مِيلٍ، فَيكونُ النَّاسُ على قَدْرِ أَعْمالِهِمْ في العَرَقِ) [١٦]. **واتە: خۆر لە رۆژی دواییدا لە خەڵكی نزیك دەبێتەوە هەتا بە ئەندازەی میلێك لێیانەوە دوورە و خەڵكی لەو كاتەدا هەریەكەو بەگوێرەی كاروكردەوەكانی خۆی لەناو عارەقدایە.**

**پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:** (يَعْرَقُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يَذْهَبَ عَرَقُهُمْ فِي الْأَرْضِ سَبْعِينَ ذِرَاعًا، وَيُلْجِمُهُمْ حَتَّى يَبْلُغَ آذَانَهُمْ) [١٧]. **واتە: خەڵكی لە رۆژی دواییدا عارەق دەكەنەوە هەتا عارەقەكەیان حەفتا باڵ دەچێتە ناخی زەویەوە و ئەمانیش هەتا لای گوێیان نوقمی عارەق دەبن.**

---

(١٦)رواه مسلم وهو في صحيح الجامع (٢٩٣٣)

(١٧)متفق عليه

(٥) یەکێکی تر لە هۆکارەکانی زیاترکردنی هەستی ترس لای بەندە بریتیە لە بیرکردنەوە لە دیمەنەکانی ڕۆژی دوایی: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلْكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَاۚ وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًاۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴿٤٩﴾ ﴾ الكهف (٤٩) . واتە: لەو کاتەدا نامەی کردەوەی هەر کەسێك دادەنرێت لای ڕاستی یان لای چەپی , جا لەو ساتەدا تاوانبار و سەرپێچیکاران دەترسن لەو نووسراوەی ناوی بەهۆی ئەو گوناه و تاوانانەوە کە پێشیان خستووە و کاتێك دەیبینن دەڵێن : لەناوچوون بۆ خۆمان ! ئەمە چۆن پەرتووکێکە کە هیچ کردەوەیەکی بچووك وگەورە نیە ئیللا تێیدا

**نووسراوە و تۆمارکراوە بە جوانی ؟! و هەموو ئەوەی کە ئەنجامیان دابوو لە دونیادا وا ئێستا لەبەر چاویانە و ئامادەیە . وە پەروەردگارت بە ئەندازەی کێشی مێرولەی بچوکێکیش ستەم لەکەس ناکات , بەوەی کە پاداشتی چاکەکار کەم بکاتەوە یاخود سزای تاوانبار زیاتر بکات لەو تاوانەی کە کردوویەتی .**

**جا بەندە بیرلەوە دەکاتەوە کە ستەمکار تۆڵەی لێ دەکرێتەوە لەنێو خەڵکیدا, وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:** (لَتُؤَدَّنَّ الْحُقُوقُ إِلَى أَهْلِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُقَادَ لِلشَّاةِ الْجَلْحَاءِ مِنَ الشَّاةِ الْقَرْنَاءِ) [١٨]**واتە: هەموو**

---

(١٨)أخرجه مسلم (٢٥٨٢)

**مافێك بۆ خاوەن ماف دەگەڕێتەوە لەرۆژی دواییدا تەنانەت ئاژەڵی بێ شاخ تۆڵەی بۆ لێ دەکرێتەوە لە ئاژەڵی شاخدار.**

**هەروەها دەفەرموێت:** (مَنْ ضَرَبَ بِسَوْطٍ ظُلْمًا اقْتُصَّ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ) **واتە: ئەوەی بە قامچی بەناڕەوا وستەم لەکەسێك بدات ئەوا لە رۆژی دواییدا تۆڵەی لێ دەکرێتەوە.**

**هەروەها دەفەرموێت:** (مَنْ قَذَفَ مَمْلُوكَهُ بِالزِّنَا، يُقَامُ عَلَيْهِ الْحَدُّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ كَمَا قَالَ) [١٩] **واتە: ئەوەی تۆمەتی زینا بداتە پاڵ کۆیلەیەك ئەوا لەرۆژی**

---

(١٩)أخرجه مسلم (١٦٦٠)والحديث الأول في صحيح الجامع (٦٢٥٠).

**دواییدا حەدی لەسەر جێ بەجێ دەکرێت مەگەر ئەوەی ووتبێتی ڕاست بێت.**

**(٦) هەروەها بیرکردنەوە لەوەی کەلە رۆژی حەشردا یان بۆ بەهەشتە یاخود بۆ ئاگر ئەوەش دوای ئەوەی لێپرسینەوە تەواو دەبێ .**

**هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:** ( ويُضرب جسر جهنم ، فأكون أول من يجوز ، ودعاء الرسل يومئذٍ : اللهم سلِّم سلِّم ، وبه كلاليب مثل شوك السعدان ... فتخطف الناس بأعمالهم، منهم الموبَق بعمله ومنهم المخردل )[٢٠]. **واتە: پردێك دادەنرێت بەسەر پشتی**

---

(٢٠)متفق عليه

دۆزەخدا و من یەکەم کەسم کەبەسەریدا تێپەڕدەبم, وە پێغەمبەران لەو رۆژەدا دەڵێن: خوایە سەلامەتی خوایە سەلامەتی, وە چەندین قولاپی لەسەرە وەکو دڕکی سەعدان وەهان و بەپێی کردەوە دەکەن بە مرۆڤەکاندا و جا هەیە بەهۆی کردەوەکەیەوە رزگاری دەبێت و هەشە تیادەچێت و دەیبات.

هەروەها دەفەرموێت: ( فيمر أولُكم كالبرق ... ثم كمرِّ الريح ثم كمرِّ الطير وشدِّ الرجال تجري بهم أعمالهم ) [٢١]. واتە: جا کەسانی سەرەتا بەسەر پردەکەدا وەکو هەورەبروسکە بەسەریدا تێپەڕدەبن .... وپاشان وەکو با و

(٢١)رواه مسلم (١٩٥)

**پاشان وەکو خێرایی باڵندە و خێرا ڕێکردنی پیاوێك و بەگوێرەی کردەوەکانیان.**

**جا ئەگەر بەندە بیری لەئاگر وشێواز وسیفەتەکەی و سەختی سزا وگەرمیەکەی و نارەحەتی ئەوەی تێیدایە کردەوە ئەوا بێگومان هەستی ترسی لا توند و زۆر دەبێت, وەکو خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ إِنَّهَا سَآءَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا ﴿٦٦﴾ ﴾ ( الفرقان: ٦٦ ) **واتە: بێگومان دۆزەخ خراپترین شوێن وقەراگایە .**

**هەروەها دەفەرموێت:** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا ...﴿٦﴾ ﴾ التحريم (٦) . **واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان بە خوای پەروەدگار و پەیامبەرەکەی هێناوە و بەڕاستان زانیوون ، و کردەوەتان بە شەرعەکەی کردووە .**

**خۆتان بپارێزن بە ئەنجامدانی ئەوەی کە خوا فەرمانی پێکردوون و بە وازهێنان لەوەشی کە یاساغی لێکردوون ، وە ماڵ و منداڵتان بپارێزن بەوەی کە خۆتانی پێدەپارێزن لە ئاگرێك کە سووتەمەنیەکەی مرۆڤ و بەردە.**

**هەروەها دەفەرموێت:** ﴿ وَجِاْيٓءَ يَوۡمَئِذِۭ بِجَهَنَّمَ﴾ الفجر(٢٣) . **واتە: لەو ڕۆژە گەورەدا دۆزەخیش هێنرا.**

**پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:** (يُؤْتَى بِجَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لَهَا سَبْعُونَ أَلْفَ زِمَامٍ، مَعَ كُلِّ زِمَامٍ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ) [٢٢] **واتە: لەو ڕۆژەدا دۆزەخ دەهێنرێت کە حەفتا**

---

(٢٢)رواه مسلم

**هەزار رەشمەی پێوەیە و هەر رەشمەیەکیش حەفتا هەزار فریشتە گرتوویەتی.**

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍ بَعِيدٍ سَمِعُوا۟ لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا ﴿١٢﴾ ﴾(الفرقان: ١٢). **واتە: کاتێکیش ئەوانەی کە باوەڕیان بەدوارۆژ نیە ئاگری دۆزەخ دەبینن وچاویان پێی دەکەوێت لەشوێنێکی دوورەوە , ئا لەو کاتەدا گوێبیستی دەنگی گڕ و کڵپە و هەناسەدانی دەبن , ئەوەش لەبەر زۆر توڕەیی وبێزاری دۆزەخ لێیان .**

**جا پێویستە موسڵمان زۆر وریا وئاگاداری ئەو تاوانانە بێت کە هەڕەشەی ئاگریان لەسەرە وەکو ریبا و درۆ بەناوی پێغەمبەری خواوەﷺ و ستەم و جگە**

**لەوانەش, و هەروەها نەبوونی ئیخلاص لە فێربوونی زانستدا:**

**پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:** (لَا تَعَلَّمُوا الْعِلْمَ لِتُبَاهُوا بِهِ الْعُلَمَاءَ، وَلَا لِتُمَارُوا بِهِ السُّفَهَاءَ، وَلَا تَخَيَّرُوا بِهِ الْمَجَالِسَ، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَالنَّارُ النَّارُ) (٢٣).

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ كَٱلْمُهْلِ يَغْلِى فِى ٱلْبُطُونِ ﴿٤٥﴾ كَغَلْىِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٦﴾﴾ الدخان (٤٣-٤٦) **واتە: بێگومان بەروبومی داری زەقوم ـ کە لەبنی دۆزەخدا دەڕوێت ـ خۆراکی ئەوانەیە کە تاوانی زۆر ئەنجام دەدەن ، وە گەورەترینی تاوانەکانیش هاوەڵبڕیاردانە بۆ خوای پەروەردگار . بەروبومی داری**

---

(٢٣)رواه ابن ماجه وابن حبان وهو في صحيح الجامع (٧٣٧٠)

**زەقوم وەکو کانزای تواوەیە لەگەڵ هاوەڵبڕیاردەراندا جۆشدەدا و دەکوڵێت ، وەکو کۆڵانی ئەو ئاوەی کە گەشتۆتە ئەوپەڕی بەرزی پلەی گەرما .**

**پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:** (لَوْ أَنَّ قَطْرَةً مِنَ الزَّقُّومِ قُطِرَتْ فِي دَارِ الدُّنْيَا لَأَفْسَدَتْ عَلَى أَهْلِ الدُّنْيَا مَعَايِشَهُمْ، فَكَيْفَ بِمَنْ يَكُونُ طَعَامَهُ؟)[٢٤] **واتە: ئەگەر یەك دڵۆپ لە زەقوم بکەوێتە سەر ئەم دونیا ئەو گوزەرانی هەموو خەڵکی تێك دەدات چ جای ئەگەر خواردن وخۆراکیان بێت.**

**حاڵی پێغەمبەران و فریشتە و پیاوچاکانی پێشوو لەگەڵ ترس وبیمی خوای گەورەدا:**

---

(٢٤)رواه أحمد و الترمذي والنسائي وغيرهم وهو في صحيح الجامع (٥٢٥٠)

**له عائیشه‌وه – ره‌زای خوای لیّ بیّت- ده‌ڵیّت:** ( أن رسول الله كان إذا تغير الهواء وهبت ريح عاصفة يتغير وجهه فيقوم ويتردد في الحُجرة ويدخل ويخرج ، كل ذلك خوفا من عذاب الله) [٢٥]**.واته: پیّغه‌مبه‌ری خوا ئه‌گه‌ر هه‌وا بگۆڕیایه‌ت و بای توند هه‌ڵی بكردایه‌ت ده‌موچاوی ده‌گۆڕا و ده‌هات وده‌چوو له ناو ژووره‌كه‌دا و ده‌چوه ده‌ره‌وه‌و ده‌هاته ناوه‌وه, هه‌موو ئه‌وانه‌ی ده‌كرد له‌ترسی سزای خوا.**

**خوای گه‌وره ده‌فه‌رمویّت:** ﴿ هُوَ ٱلَّذِي يُرِيكُمُ ٱلۡبَرۡقَ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا وَيُنشِئُ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ ١٢ وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعۡدُ بِحَمۡدِهِۦ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ مِنۡ خِيفَتِهِۦ وَيُرۡسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَآءُ ﴾ الرعد (١٢-١٣) ، **واته: ئه‌و خوایه‌یه كه له نیشانه‌كانی**

---

(٢٥) متفق عليه

**دەسەڵات و بوونی خۆیتان پیشان دەدات وەك ئەو هەورە بروسکەیەی کە دەیبینن ـ کە بریتیە لەو ڕووناکیە پرشنگدارەی کە لەنێوان هەورەکانەوە دەردەچێت ـ کە ئێوە دەترسن بەهۆی ئەوەوە بروسکەی ئاگر و سوتێنەر لێتان بدات ، و لەلایەکی تریشەوە بەتەمای بارینی بارانن لێیەوە وچاوەڕانی ڕەحمەتن , وە بە توانا و دەسەڵاتی ئەو خوا پاك و بێگەردەیە کە هەوری قورسی پڕ لەئاوتان بۆ پێك دەهێنێت بۆ سوود و بەرژەوەندی ئێوە . هەورە بروسکە ستایشی خوای پەروەردگار دەکات بەشێوەیەك کە ملکەچی وزەلیلی خۆی دەنوێنێت بۆ پەروەردگاری خۆی ، و فریشتەکانیش خوای پەروەردگار پاك ڕادەگرن و هەمیشە یاد و زیکری دەکەن لەبەر بیم**

**وترسیان له‌په‌روه‌ردگاریان , هه‌ر ئه‌ویشه كه هه‌وره تریشقه‌ی له‌ناوبه‌ر ده‌نێرێت بۆ سه‌ر زه‌وی و هه‌ركه‌سێكی پێ له‌ناوبدات له دروستكراوه‌كانی كه ویستی له سه‌ره , به‌ڵام ده‌بینیت بێباوه‌ڕان ده‌مه‌ده‌م ده‌كه‌ن له‌سه‌ر تاك وته‌نهایی خوای په‌روه‌ردگار و ده‌سه‌ڵاتی به‌سه‌ر زیندووكردنه‌وه‌دا , له‌كاتێكدا كه ئه‌و خوایه هێز و ده‌سه‌ڵات و لێدانی زۆر سه‌خت و له‌ناوبه‌ره بۆ ئه‌وانه‌ی كه سه‌رپێچی ده‌كه‌ن .**

**وه ئه‌بوبه‌كری صدیق رضي الله عنه پیاوێك بوو گریانی زۆر بوو له‌ترسی خوادا و به‌شێوه‌یه‌ك كه نه‌یده‌توانی نوێژ بۆ خه‌ڵكی بكات له‌به‌ر زۆری گریانه‌كه‌ی.**

**وە عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ ئەگەر ئایەتێکی هەڕەشە ئامێزی ببیستایە لە قورئاندا دەبورایەوە و لە دەموچاویدا دوو خەتی ڕەش هەبوون بەهۆی زۆری فرمێسکەوە, ڕۆژێك بەسەر گوێدرێژەکەیەوە ئەم ئایەتەی خوێندەوە:** ﴿ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَاقِعٌ ۝٧ مَّا لَهُۥ مِن دَافِعٍ ۝٨ ﴾ ( الطور: ٧-٨) **لەسەر گوێدرێژەکەی دابەزی و پاڵی دا بەدیوارێکەوەو بۆ ماوەیەك بەو شێوەیە مایەوە.**

**وە ئەبوهورەیرە ﵁ لە نەخۆشیەکەیدا دەگریا وتیان بۆ دەگری؟ ئەویش وتی: " من بۆ ئەم دونیایەتان ناگریم, بەڵکو بۆ دووری گەشتەکەم و کەمی توێشووم, وا من بەرەو دوو شوێن بەڕێ دەکرێم یان بەهەشت یان ئاگر: جا نازانم لەکامیاندا دەبم".**

* وە موسای کوڕی مەسعود – ڕەحمەتی خوای لێ بێت- دەڵێت: ئێمە کاتێك لەگەڵ سوفیانی سەوریدا دادەنیشتین وەکو بڵێی ئاگر چواردەورمانی داوە لەبەر ئەو ترس وناڕەحەتیەی دەمان بینی لە دەموچاویدا.

جا سەلەفی صالح بەو شێوەیە بوون کە ترس کاریگەری کردبووە سەریان و بەوهۆیەوە دامەزراو ودینداربوون لەسەر ڕێگای ڕاست.

وصلَّى الله على نبينا محمد وآله وصحبه وسلم .

--------------------------------

وەرگێڕانی

ستافی ماڵپەڕی بەهەشت و وەڵامەکان

ba8.org - walamakan.com

جج